# قالاو یانی قەفەسێکی خاڵی

## هەڵبژاردەی شێعر

**کەماڵ ئەمینی**

**سلێمانی بەهاری**

2007


**سەرپەرشتیاری پرۆژە: جەبار سابیر**

**قالاو یانی قەفەسێکی خاڵی**

**بابەت: شێعر**

**نووسەر: کەماڵ ئەمینی**

**بەرگ: رەزا موورادی**

**رازاندنەوە: موحیەدین ئەمینی**

**پیتچن: کۆمپیوتەری ساناو- جوانرۆ**

**سەرپەرشتیاری هونەری: ئارام سدیق**

**سەرپەرشتیاری چاپ: ئاسۆ پێنجوێنی**

**ژمارەی سپاردنی(281)ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە.**

**لەبلاوکراوەکانی پرۆژەی کتێبی یانەی قەڵەم زنجیرەی ژمارە(19)**

یانەی قەڵەم ـ سلێمانی ـسابونکەران ـ شەقامی گۆران، بینای هەورامان، نهۆمی سێهەم ژمارەی مۆبیل: (07701575726)



**پۆستی ئەلکترونیکی نووسەر:** kamal_a78@yahoo.com

**وبلاگی نووسەر:** www.kamalamini.blogfa.com

# پێڕست

وەك پێشەكی

## زمان لە سێحرەوە تا شكست

زمان ئەو پانتاییە مەزنەیە كە لە سادەترین شێوەی خۆیدا بەستێنێكی هەمیشە ئامادەیە بۆ گونجاو كردنی ئەمری نەگونجاو، بە واتایەكی‌تر ئیمكانێكە بۆ دەركەوتنی نامومكینەكان و فەزایەكی دیارە بۆ بابەتی كردنەوەی نادیار و دیاردە زەینییەكان.

ئەگەر لەو روانگە هایدگر- ییەوە چاو لە زمان بكەین "بوون" لەم پانتاییەدایە كە واقیع دەبێت هەموو شتێ وەك خەیاڵ و خەون و ئارەزوو تا وەهم و ترس و... بە گشتی مرۆڤ بوونی لەناو زماندا مەجالی دەركەوتن پەیدا ئەكات، تەنانەت "مەرگ" كەئەتوانێ لە زاتی خۆیدا " نەبوون" بێت لە ناو زماندا بوونی هەیە.

لە لایەكی دیكەوە زمان لە واقیعی خۆیدا سیستمێكی رێساییە لە دالەكان، دیارە خودی ئەو سیستمە دەستكرد و ساختەی زەینی مرۆڤە، بەڵام سەرەڕای ئەو پرسیارە كە دەپرسێ ئەندێشە زمان دروست ئەكات یا زمان ئەندێشە؟ پێم وایە ئەگەرچی ئەمرۆكە ئەو پەیوەندییە لە نێوان زمان و ئەندێشەدا پەیوەندییەكی دوو لایەنەیە لە



هەمان كاتدا مرۆڤ بە بێ "وشە" ناتوانێ بیر كاتەوە ، بەم پێیە ئەكرێ بڵێم دازاینی دیكارت " من بیر دكەمەوە كەوابوو بوونم هەیە " بە بێ‌زمان مەحاڵە مەگەر لە دەرهەستترین وێنەی زەینی دا.

پێڕەوی ئەو بۆچوونە سووسوور _ ییە، هەر دالێك بۆ خۆی هەڵگری مەدلوول یان چەند مەدلولێكی دیاری كراوە كە لە تانوپۆی دەق دا ئەتوانێ ببێ بە نیشانە، یا خود لە پرۆسەی زەماندا مەدلوولەكان لە خۆی ئەكاتەوە و ئەگۆڕدرێ، تەنانەت وەك سێحرێك بە ئوستوورەیەكەوە راستەوخۆ دەق بەرهەم ئەهێنێ.

بێ گومان سەرەڕای ئەو یاسا و رێسا زمانییانە، زمان لە هەندێ قەوارەدا ئەو توانایەی هەیە كە تەجاوزی ئیستانداردەكانی خۆی بكات و لەو رێسا و یاسایانە لا بدات و لە پڕێكا مرۆڤ بكاتە باڵندە و دەریا بباتە سەر لووتكەی شاخێك و مشتێ چاو هەڵواسێ بە تەنافێكدا و...

ئەمەش بەو مەرجە باسی زمانی مرۆڤ بكەین چونكو پێم وایە خاڵی سەرەكی جیاوازی نێوان زمانی مرۆڤ و زمانی گیانلەبەرەكانی‌تر ، ئارەزوو و خەون و گومان و وەهمە كە لە زمانی مرۆڤدا روو ئەدا. داخم ئەسپ ئەتوانێ ئارەزووی هەبێ سوارەكەی لەقاوی نەكات؛ یا خود گومان بكات لە پتەوبوونی لەقاوەكەی ؟ یا خود ئایا سەگ دەتوانێ ئارەزوو بكات خاوەنەكەی گۆشتی مەڕی بۆ بهێنێتەوە؟ یان با بڵێین ئایا ئەتوانێ گومان لە خاوەنەكەی بكات كە ئەو گۆشتەی دزیوە یان كڕیوە؟ ئایا هیچ پشیلەیەك ئارەزووی پەروازی هەیە؟

لێرەوە ئەمەوێ بڵێم ئارەزوو، خەون، گومان و وەهم بەشێكی گەورەن لە سێحری زمانی مرۆڤ و زۆریش كاریگەر بووە لە سەر ژیان و

بیرکردنەوە و کەشف و داهێنانەکانی . (مرۆڤ ئارەزووی کرد پەرواز بکات و پەروازی کرد و ... )

لایەنی سێحراوی زمان – لە باڵاترین شێوەی خۆیدا – لە قەوارەی شێعردا خۆی ئەنوێنێ لێرەوەیە کە ژووەر زمان ئەخولقێ و تۆڕێکی بەر بڵاو لە مانا دروست ئەکات کە ئەتوانێ پێڕەوی شوێن – کات و خوێنەرەکانی ، رەنگ و رووی جیاواز و بگرە دژوار لە خۆی نیشان بدات ئەگەرچی لە نەهایەتدا هەموو ماناکان و لێکدانەوەکان کە هەر کام هەڵگری بەشێ لە حەقیقەتی دەقەکەن مەحکوومن بە خودی ئەو دەقە یان با بڵێم هەموو شتێ لە نەهایەتدا پەیوەستەو پێویستی بە زمان هەیە.

شێعر بەو پەڕی کەڵك وەرگرتن لە سێحری زمان لە رێی فەنتازیا و شهوود و دیدی سووچدار و زەینی جوانیناسانەی شاعیر و... ئەتوانێ هەڵگری بەشێ لە حەقیقەتی بوون بێت کە گرێدراوە بە رابردوو و ئێستا و ئایندە و لە هەمان کاتدا پڕە لە نامومکین و نادیار لە دونیای واقیعدا.

شێعر لە رێی ئەو سێحرەوە وەك ژوورە زمانێك لە پرۆسەی زەماندا خۆی پرۆسیسە ئەکاتەوە تا رادەیەك کە ئەتوانم بڵێم شێعر هەوڵێکی هەمیشەییە بۆ کەشفی حەقیقەت بە شێوەیەکی رێژەیی.

**ز**مان بە هەموو سێحرێکەوە تەنانەت لە قەوارەی شێعردا شکست ئەهێنێتەوە، شکستێك کە گەرەنتی بەردەوام بوونی شێعر و کەڵکەڵەی



کەشفی حەقیقەتە و دواتر لایەنی بوارەکانیتر وەکوو فەلسەفە ئەگرێتەوە.

ئەگەر پلات وتەنی شێعر گشتی کردنەوەی ئەزموونە تاکەکەسییەکان بێت ئەو پرسیارە دێتە ئاراوە کە زمانی شێعر بەهەموو توانایی و پوتانسییەلێك کە لە خۆیدا هەڵیگرتووە تا چ رادەیەك توانای بابەتی کردنەوەو درکاندنی ئەو ئەزموونە ژیانکراوەی هەیە کە تایبەتی دانەرەکەیەتی؟ یان بە واتایەکیتر ئایا هەموو دیاردە زەینییەکانی زەین و دەروونی شاعیر لە ناو زماندا روو ئەدەن ؟ بێگومان ئەمە تەنیا شکستێك نیە کە زمان رووبەرووی ئەبێتەوە بەڵکوو زمان لە بەرانبەر رەنج و مەرگدا مەحکوومە بە شکستێکی زۆر گەورەتر بۆیە من بۆ خۆم لە بەرانبەر کێشەی ئەنفال و هەڵەبجەو... لە ناو شێعردا ترسێکی گەورەم هەبووە چونکوو نە من نە هیچ شاعیرێکی دیکە دەرەقەتی ئەو کارەساتانە نایەت. رەنگە ئەو دۆخە پارادۆکسیکاڵەش لە نێوان جوانی و ئێستاتیکای دەق و رەهەندی رەنجی کارەسات لە ئاست و قووڵی رەنجەکە کەم بکاتەوە و تەنانەت بیشارێتەوەو بە شێوەیەك کە خوێنەر نەزانێ لە دەقەکە چێژ وەربگرێ یا خۆ بگرێت؟ بۆیە هەمیشە ئەو پرسیارە لە خۆم دەکەم ئایا غەدر نییە ئەنفال و هەڵەبجە بهێنمە ناو قەوارەی شێعر؟

دیارە "مەرگ" بەشێکە لە ئەمری واقیع کە ئەزموونێکی خەراپە و خراپیش ئەزموون دەکرێ بۆیە ئاستی شکستی شێعر لە بەرانبەر مەرگدا زۆر گەورەترە لە شکستەکانی تر تا رادەیەك کە شێعر خۆی بۆ خۆی کردەیەکە کە لە ئەنجامدا شکست ئەخوات.

تەواوی ئەو خوێندنـەوە و لێکدانەوانـەش کـە لـە سـەر مـەرگ ئـەکرێ، ئەتوانن هـەر کـام گۆشـەیەك لـە حەقیقـەتی مـەرگ بن بـەڵام هـەرگیز خودی حەقیقەتەکە نین. ئەمجارە ئەگەر لە سووچێکی ترەوە ئـاوڕ لـە وتە بەناو بانگەکەی هایدگر بدەمەوە کە ئەڵێ " زمان خانـەی بـوون ــ ـە " مەرگ لە کوێنەی بوون دا قەرار ئەگرێت؟ ئەگەر زمـان خانـەی بوونە مەرگ هەیەو روو ئەدا بەڵام مەرگ خۆی بـۆ خـۆی نەبوونـە ئـەم دۆخە پارادۆکسیکاڵە وا دەکات کە مەرگ لە زماندا تەنیا وشە یـا خـود نیشـانە بێـت و لـە شـێعردا تـەنیا وەسـف و تـەعبیری خـەیاڵی و لـە ئەنجامدا شکست! بەڵام شێعر بەو پێیە کە بەرەو ژووەر زمان ئەچـێت ئەتوانێ لە خۆیدا خانەی نەبوونیش دروسـت بکـات، خانـەی خـەون و خـەیاڵ و نادیـار و مـەرگ، بـەڵام تـا چـەند لـەو پرۆسـەیەدا سـەر ئەکەوێت ؟

شێعـر لــە هــەر وڵاتێــك دا لــەڕووی رەهەنــدی نــاوەکی و دیــدی جوانیناسانە کە پێوەندییـەکی راسـتەوخۆیان هەیـە لەگـەڵ رەهەنـدی عەینی و فۆرماسیونی شێعر، یا خـود بـا بڵـێم هاوتـەریبی یـەکترن و لـە یەکدی جیا ناکرێنەوە لە گەڵ پرۆسەی گۆڕان و وەرگۆڕانـەکانی واقیـع لە هەر روویەکەوە ئـەویش تووشـی گـۆڕان بـووە. نموونـە لـە شـێعری پۆلئیـادی یۆنـانو ئیلیـزابتی ئیـنگلتراو عـەرووزی عـەرەب و پـەنجـەیی کورد و... تا ئەمرۆکەی شێعر لە وڵاتـە جیاجیاکانـدا هـەموو شـاهیدی ئەو پرۆسەیەن.



من بە باوەڕەم کە تێکستی واقیع کاریگەرە لە سەر تێکستی شێعر یان بـە واتایـەکیتـر واقیـع کانتێکسـتێکە بـۆ تێکسـتی شـێعر و هـەموو داهێنانەکانیتر ئەمەش بەو مانایە نییە کەکاری شـێعر تـەعبیر کردنـی واقیعە لە ناو زماندا، بەڵکوو روانینێکی تایبەت و سووچدارە لـە لایـەن شاعیرەوە تاڕادەیەك کە ئەو واقیعە هەڵئەشێوێنێتەوەو سەر لە نوێ لە ناو دەقدا ئەیخولقێنێتەوە کە لـە شـێوەی مـانۆڕێکی پـڕ لـە تەمهیـد و تەکنیك خۆی لە ناو زماندا ئەدۆزێتەوە. لە لایەکیترەوە هـیچ گـۆڕان و تازەگەرییەك لە ئەمرۆی شێعردا رەت کردنەوەی داهێنانـەکانی دوێنـێ نییـە بـەڵکوو پـەی بردنـە بـە گـۆڕان و کاریگـەری سـەردەم و زەمانـە جیاجیاکـان و پێوەسـتە بـە خوێندنـەوەی تـازە و رۆشـنبیری و دیـدی ئێستاتیکای نوێ و بزۆز بوونی زەینی شاعیر. پـێم وایـە تازەگـەری لـە شێعردا هەوڵێکی تازەیە بۆ کەشـفی حەقیقەتـە بچـووك و گـەورەکان و بابەتی کردنەوەی رووداوە زەینییەکان لە پرۆسـەیەکی گـەورە کـە لـە راستیدا بەردەوامیی هەمان شکستە کە پێشتر ئاماژەم پێدا، ئەگەرچی پێم وایە هیچ تازەگەرییەك ئەگەر عەقڵێکی نوێ و روانینێکی تایبـەت و مۆراڵێکی شاعیرانەی لە پشتەوە نەبێ ناچێتە خانەی ئەم پرۆسەیە.

وەکوو چەند سەرنجێکی خێرا:

- بێگومان شێعری منیش — وەك ئەکتەرێ لە دونیای شـێعردا — بەردەوامی پرۆسەی شکستی شێعرە.
- تازەگەری لە لای هـەر نەوەیەکدا راسـتەوخۆ یـا ناراسـتەوخۆ هەوڵێکـە بـۆ کـەم کردنـەوەی ئاسـتی شکسـت لـە قـەوارە و

روانینێکی تازەدا ( کە ئەنجامەکەی شێوەیەکی ترە لە شکستی دووبارە )

- یاخی بوون لە ناو زماندا و تەجاوزی ئیستانداردەکانی زمانی سەنتەر لە لایەن شێعرەوە بە گشتی دیالکتیکی لادان لە سەنتەر، راوەستانە لە بەرانبەر هەر چەشنە سەنترالێزمێك لە هەر قەوارە و مانایەکدا.
- سیستمی یاخی گەری لە زمانی شێعردا ئەگەر ببێ بە سیستمێکی ئیستاندارد بۆ شێعر، گوتاری زاڵ بەرهەم ئەهێنێ و ستاتیکا و خوێنەر و روانین و... باو، بۆیە شێعر بەردەوام ئەبێ ئیستانداردەکانی خۆی بشکێنێ یا بە واتایەکی تر یاخی بوون دەبێ پرۆسەیەکی بەردەوام و هەمیشەیی بێت و مایاکۆفسکی وتەنی ((شەپازللەیەك لە چێژ و سەلیقەی گشتی ))
- شێعری کوردی پتر مەیلی لادێی تیا خولقاوە تا شار! لە کاتێکدا پێم وایە شێعری نوێ زادەی واقیعی شارە، ئەگەرچی شاری کردنی شێعری کوردی زۆر ئەستەمە، چونکوو شار لەمانای راستەقینەی خۆیدا زۆر گەورەتر و بەربڵاوتر لەو واقیعەیە کە ئێمە تێیدا دەژین. بێگومان کەڵەکە بوونی ماڵەکان و زیاد بوونی جەماوەر مانای شار ناگەیەنێت و... بەڵام ئەمە نابێتە هۆی خافڵ بوون لەو گۆڕانە جیددییانە کە کۆمەڵگای کوردی رووبرووی بووەتەوە.



- لە شێعری مندا واقیع بەوجۆرەیە کە من ئەیبینم و بڕیار نییە وەك هەمووان چاوی لێبکەم ئەگینا کامێرا زۆر جوانتر و ئاشکراتر تەعبیر و تۆماری واقیع دەکات.
- سەرەڕای هەموو هەوڵەکانم بۆ بگۆڕ کردنی فیکرو زەینم ناکرێ نکۆڵی لە نەستی خۆم بکەم کە میراتی مێژوویەکی دوور و درێژە. بەڵام پێم وایە زمانی بگۆڕ و بزۆز بەستێنێکی ئامادەیە بۆ بگۆڕ کردنی زەین.

ئەم کتێبە کە لە دە شێعر پێکهاتووە – وەك دیارە – هەڵگری کۆمەڵێ ئەزموونی شێعرین لە ماوەی پەنج شەش ساڵی رابردووی ژیانی شاعیریم.

بێگومان هیچ دیاردەیەکی ئەدەبی یا هیچی تری تەواو پۆزەتیڤ شك نابەم کە ئەم شێعرانە لە لای خۆمدا بە تەواو پۆزەتیڤ لە قەڵەم بدەم بەڵام هەڵبژاردنی ئەم دە شێعرە بۆ ئەوەیە پێش هەر شتێك رەوتی شێعری خۆم تا ئەمڕۆ بناسێنم و بڕیاریش نییە دواتر روانینم بۆ شێعر نەگۆڕدرێ، چونکوو پێم وایە لە پەنای جەوهەری شاعیری بزۆز بوونی خودی شاعیر لە هەموو شتێك گرنگترە. هەر لێرەوە ئەڵێم باوەڕم بەوە نییە کە شاعیر ئەبێ حەتمەن و بێ سێ و دوو خاوەنی زمانێکی تایبەت بەخۆی بێت و تەواوی داهێنانەکانی لە سەرەتاوە تا ئاکام پێرەوی بێکەم و کاستی ئەو سیستمە زمانییە بێت بەڵکوو لە هەموو هەل و مەرجێکدا گۆڕان و یاخی بوون پێویستە، تەنانەت بۆ نموونە لە یەك کاتدا ناکرێ لە سەر "مەرگ" و "خۆشەویست"بە یەك زمان بیر بکەینەوە.

هەندێ لەو شیٚعرانە کە لەم کتێبەدا هاتوون پێشتر لە گۆڤار و چاپەمەنییەکاندا بڵاو بوونەتەوەو ئێستا لەم کتێبەدا بە هەندێ گۆڕانەوە ئامادەن، هۆی ئەوەش پەی بردن بە هەندێ لەو خەسارانە بوو کە لە شێعرەکاندا بەدیم ئەکرد . لە لایەکیترەوە چونکوو فەزای هەندێ لەم شێعرانە بەنیسبەت فەزای شێعری کوردییەوە جیاوازترە زەمینەیەکی ئامادەیە بۆ هەر چەشنە هەڵویستێك لە لای خوێنەر بێگومان منیش بە سنگێکی ئاوەڵاوە خۆم ئامادەی ئەو هەڵویستانە کردووە بەڵام بە دڵنیاییەوە نیگایەکی رووکەشی یان خێڵەکییانە لە لای مندا بە خوێندنەوە لە قەڵەم نادرێ. دیارە حەقیقەت بە لای هیچ کەسێکەوە نییە نە بەلای منەوە کە دانەری ئەو شێعرانەم نە بە لای تۆ وە کە تەنیا خوێنەرێکی، بەڵکوو حەقیقەت لە لای هەمووانەو لە لێکدانەوەکاندا بەشێکی ئەوە دەردەکەوێ. بە تایبەت لە زەینی ئەو خوێنەرانە کە کەڵکەڵەی خوێندنەوە و رەخنە و کەشفیان هەیە.

هەر لێرەوە بە پێویستی ئەزانم زۆر سپاسی دوو بەرادەری ئازیزم بکەم کە بەم کتێبەوە خۆیان هیلاك کردو یارمەتی زۆریان داوم کاك **موحیەدین ئەمینی** و هونەرمەند **رەزا مورادی**.

به سپاسەوە

ك . ئەمینی

2006/10/26

**دوا ئاخر بوو**

**دەستمان پێکرد**

**ئێستاش ماوین تا سەرەتا**

**چۆن بمرین**

**نەبز**

**چەندە بچووکە بۆ بەردەوام بوون**



## من و مەرگ و شەوێکی ڤایرووسی

**تەمەنی شەو لە نیوەیە**

**ساڵ لە پەڕ.**

□

**ئەمە منم**

**بە ئارامی باوەڕێکی بێگیان**

**دەخزێمە ژێر پێستی ئەفریقی شار و**

**ئەوە کۆڵانە تەنگ و تاریکەکە، رەگیلەیەکی سیمانییەو**

**بەرە بەرە بەرەو شادەمارە قیرینە ئەمبات**

لێواری دەمارەکە
پاش دەرخواردی ئەفیوونی
رۆژێکی چڵکنی تەژی هەڵاڵە و جم و جووڵ
نەبزی بە ئارامی لێئەدا
نەبزی بە ئارامی مەرگی  پیرە هەژاری دراوسێ...

خشت خشت دیوارەکان
سلوول سلوول جەستەی شارن و
لە بارستایی هیچ ماڵێک دا
توخمی پووچی ئوکسیژن
حەزم هەتا هەناسەیەک نابات
گوڵــە - ! — گــەنم مــردووە ، بــەرۆژە
خەوتووە
جار و بار
هارە
هاڕی
موتۆڕێ
هاشە و
هووشەی
ماشینێکی



سەر شێت
یان گەفە گەفی بێ سنکێکی وێڵ
وەکو ڤایرووسێکی نەخۆش
هەڵدەواسێ بە گولبوولی بێدەنگی پەنجەرەیەکی سوورو نەرم و
ئارامیی باوەشێکی گەرم و گەمژەو خەوێکی هەتایی تێک ئەدا
من      ئەم دڵەم بە تۆزقاڵێ هەر لێئەدا
ئەشێ موژدەی تلووعێکی ترو نەرمم پێبدا
- کوڕی باش! ئەی نایدا؟ -

نیئۆنەکان لە بەرزاییەوە
دژ بە تەنیایی و خەیاڵی نامۆم پۆل پۆل گولبوولی سپی ئەنێرن
با
شمشێری تیژ و وەحشی با
دەست و پەنجەی شار زامدار ئەکا و
گەڵا
گەڵا
دڵۆپە زەردەکان
بە سەر ئەم شادەمارەدا دەبەسترێن
گوڵــە - ! — گــەنم مــردووە بــەرەوژە
خەوتووە
ئاخ! « دەروێش میرزا » ش

گۆڕەپانە گەورەکە
دڵێکی سەوزە و کە گوێی لێ ئەگرم
لە تاوی ئازارێکی کۆن   کون کونەو
بە تۆزقاڵێ هەر
تۆ بڵێی چرایەک ئەگیرسێ یان ئەم خاکە بێ باوکە
وردە وردە گیان ئەدا
[ وەک چۆن کەسێ لە کاتی ئاویلکەدا شینی بۆ ئەگێڕن
کۆڕێ هەسارەی گەمژە لەو سەرەوە
قیتە قیت و بێخەم  سەیری ئەکەن ]
پەیکەرەکەی « مەولەوی » ش لە سەر سەکۆ بەردینەکە
بە چاوی بێ چاوییەوە ماقی دوورانەو
دەقی ئەم شێعرەی هەڵدەواسێ بە رۆحما:
« ئیمشـــەو  هـــەم دیســـان دەروون پـــڕ
خەمەن
ئەساســـەی مـــاتـــەم جـــە لامـــان
جەمـەن
نە تاو دووری....
رەنگە
رەنگە مەولەویش وەک من
لەم قەفەزەدا لە فڕین نامۆترە
لەم بۆشاییەدا لە هەناسە...



وەک من لەم شارە دا...

تۆ بڵێی ئیمشەو مەرگ هەرا دەکات و
شار بەرە بەرە گیان ئەدات؟
نە ء/
گوڵە/ گەنم خەوتووە بەرۆژە...
ئەگەر مردن بە وەستانی گۆڕەپانە سەوزەکەیە
وەک کاتژمێرە سوورەکەی پیرەمێردی دراوسێ *
یان زلان کە خوێنی شار بڕێژێ
یان پڕ بوونی ماڵەکان لە $co_2$
بریا ئەو جا وەکوو سوارێ لەحزەی ئاویلکەدانی ئەسپەکەی
بە تیری سەفەرێکی بێ گەڕانەوە ، خەلاسی کەم
– گوڵە سەفەری بێ گەڕانەوە لە دایک بوون بوو کە
بوو –

مەرگ!
نە ئەوەیە کاتژمێر لە لێدان...
یا خود سەمای زلان و میوانی $co_2$ –ش

* ئاماژەیە بە شێعرێکی ئەحمەدی شاملو

مەرگ

ئەزموونێکە  پوورتوکێنەر

لە درێژەی جادە وەهمینەکانی خەیاڵێکی شاعیرانە

ئەوە رۆحە سەمای مەرگ دەرک ئەکات

نە جەستە

نە زمان

نە شێعر...

پایزی 1999- جوانرۆ



## هەنگاو لە دایەرەدا کاول ئەبێ

... دەست پێکرام

حەوت رۆژ

دەرفەتی پەنجەرەیەک بوو بۆ سەرەتا

هیچ وشەیە

هیچ کاغەزێ

هیچ من — ێ

[ هیچ

چەندە کەلامێکی ساوا بوو ]

□

من 58/7/1

تا هاڕە هاڕی
موتورێکی
ئەم
بەیانییە
هیچ تا هیچ موسافیرم

سەرەتا... ئاخ! ... سەرەتا
کە دەست پێکرام تەنیا حەوت رۆژ
□
لە شەرمی خۆر
پەنجەرەکەم تەنیا سێبەری نەردەکانم بۆ ئەخوێنێتەوە
– سەرەتا دەرفەتی سێوێ بوو کە کەوت –
[ شەو
لە لاپەڕەیەکدا جێماوم
[
□
پڕە لە خوێنی رەش/ جادە
لە نوتفەی مەوداکان
جادە لە دەمارە کزەکانی هەنگاو حەرام حەرامێ رێ ئەزێ

من



لە جنووبی‌ترین کاولستانا
ژمارە پێڵاوەکانم
سەرگەردانن

ئێستا خەریکە شێعرێ بنووسم
ئەگەر نەینووسم
ئەشێ مناڵەکانی شەڕ بکەونە
بەر
بارانی
بومب ( شاعیر چەن خۆشە لە خۆیا )
یەکەمجار سێویش وەها داکەوت
تا فڕۆکەیەک بفرێ
کەس نیە بڵێ ئاغا خۆت خۆش
[ هەنگاو
لە دایەرەدا کاول ئەبێ ]
□
نەبز
چەندە بچووکە بۆ بەردەوام بوون

تاکسییەکان بەردەوامن
تاکسییەکان بەردەوامن
تاکسییەکان

بەردەوام سوورن لە موسافیر

پیادەڕۆەکان

بە دووپات بوونەوەی هەرچی ڕۆژم موعتادن

هەرچی ڕۆژە [

شەو

لە لاپەڕەیەکدا جێدەمێنێ ]

من

لە گوێما

سواری شکانی خۆم ئەبم

خۆر

لێی ئەخورێ

ئەم جادە تا ئەو پەڕی هیلاکییە

□

تکای دەستێ

لە ئاسمانا سپەردە ئەکرێ

تکای دەستێ

لە سەر عەرزا درێژ ئەبێتەوە

تکای دەستێ

بۆ هەمیشە ساردە

من



دەستم

تکای لە نووسینا

گوم ئەچێ

ڕاستییەکەی

ئەم ڕۆژانە شەکەتم لە نووسینی دەنگی سێو

هیچ

پەنجەرەیەک نافڕم

کزم لە ئەندیشەی قەرەبوو دانی منداڵیم

[ شەرمی هەنگاو لە خەیاڵی سەفەردا

ئە

ڕ

ژ

ێ ]

– منداڵیم مندالێ بوو تەنانەت بە تۆپێ نەچوو  و چوو –

□

سێبەرەکان

کۆتاترن لە هیلاکییم

پەرواز

کاول بوونم درەنگ ئەخات

– مەرگم چەند بارە –
سەرەتا... ئاخ... سەرەتا
تەنانەت نیشتمانێکم نەبوو تا لەت بێت

من 58/7/1 - ی خۆر
تا تراویلکەی ئەم جادە
بە دوای دوایین نوختەی دایەرەدا
ئەنووسم

بێدەنگییەک
لە خۆما دەحەپسێم
بۆ مەکین و جنووبییەکان
ئەشێ مەکین بزانێ هیچ بێدەنگییەک برسێتی شەرم ناکات
خۆر
هەر خۆرە و ئەخورێ لە جادە هیلاکە و – لێگەرێن...
تکایە ڕامگرن دابەزم
دایکم بۆ من بێزووی بە هیچ
کرد

زستانی 99 – جوانڕۆ



نەء

با لە « نە » وە دەست پێبکەم
نەء – کە سەرەتای چەمکی نیگات بوو
کاتێ دێڕی تەوێڵی من
حەقانییەتێکی تاڵ هاتە بەر چاو
نەء – لە شینایی دەقی چاوتا
نێوان قەتیس مان و ڕژان
لە ئەنجامدا
پیتەکانی لاپەڕەی گۆنات ئەشێعرێنێ...

□
سەردەمێکە تۆ ئەڵێی:
« بەفر بۆ تووانەوە و باران بۆ بووژانەوە – س »

جاران گەرچی لە ئاخ سەختتر بوو
– بۆ هەوێنی سکاڵای دڵداری –
دەمگوت: ئا
چیدی ماڵەکەم!
حوکمە بڵێم: نەء !
ئەوەی دەتوێتەوە رۆحە و
ئەوە گیانە و
لە یاسای زەمەندایە کە شەرمی مۆم لە بەرجەونێکی ئەنگوستەچاو
بـــــــڕی
ناکا...
لە دونیای من دا
خۆر لە درزی نەتوانینەوە سەیرم ئەکا
ئاسمان بێڕەحمانە چڵکنە
بۆیە باران تابلۆی گریانێکە و هیچی تر
□
عومرێکە لە درێژەی هێڵە ژەنگ هێناوەکانی راستییەکی تاڵ،
بە گیانی گەمژەی خەیاڵمەوە دژیم و بە بێ خۆ زیندووم و هەنگاو و هەنگاو و
لەم بۆشاییەدا هەناسە ئەکێشم...

سەیرە ماڵەکەم !



ئەو گیاندارانەش لە دەور و بەرمن
لە خەیاڵی من گەمژەترن
( چاویان پێوانەکەی حەوت هەنگاوە و
دڵیان بنگوستێکە و دوو پل
کە مێشکیان لە چوار سم زۆرتر تێناپەڕێ )
□
تا ساتێ وەک من تەنیا بیت
تا چرکەیەک چێژی ئازارم بکەی،
شووشەی چاوەکانت بشکێنە
تاسە — تراویلکەیەکی ئاوسە لە کاتی تینوویی
هیوا — بەزەییەکە و هەنگاوە ساواکانی ئەندیشەت فریو ئەدا
عومرێ بۆ ئۆخەیەک رادێی بە « ئاو » و
بەرە بەرە « ئاخ » گەمارۆت ئەدا
کە تۆ هێشتا لە رەمزی ئاو نازانی
ئاو دەچێ ماڵەکەم! دەچێ لە پیاو بە سەرگەردانییەوە
لە پیاو ئەمجارەیان بە شەرمەوە
لە پیاوێکی بێ نان و مان
کت وپڕ
تا دادگاییم نەکەی
خۆت بکە بە پەنجەرەیەک شووشەکانی هەموو ماتن

کەس دەقی چاوت نەخوێنێتەوەو نیگای کەس ئارمت نەکا
تا بزانی چاوت هەرگیز سەمای تەنیایی منی ئارام نەکرد
ئارامیی من هەموو شەوێ لە مەیانی « مەولەوی » دا
هاوشانی کاروانی دیاردە لاستیکییەکان
دەخزێتە باوەشی دارەمەیتی فەرامۆشیو
هەرکە بیر لە هەڵکردنی چرایەک بکەم دەڵێ:
نەء ....
نەء ماڵەکەم

زستانی 2000 جوانرۆ



## لە هەمیشەوە هەتا دۆزەخ تاوان بدوێین

بمبوورە
سەرەتای ئەم شێعرە، لاوکێکە
بۆم نانووسرێ

با بزانی
عومرێکە لە ئاستانەی مەرگماندا
دارستانێک سێو رەمزی ، « با » ئەدرکێنێ و نازانی
کانیاوەکان هاژەی « ئاخ » یان لێدێ و...
کاڵ بووین
کاڵ! ( گەمژە )

کاڵتر لە رەنگی خودا

کوێر ڕەنگ بووین

- ڕەش و ئیتر هیچ -

من وتۆ

قەت تەڵایی تاوانمان تاقی نەکردووە

تەڵایی نەبووین

ئینسان لە سەرمانا کڵاوێ بوو کە نەو

نیشتمان لە دەستمانا سێوێ بوو کەوت

چیدی با تاوان بدوێین

لە هەمیشەوە هەتا دۆزەخ سمیناریێ تاوان

کە من پێویستم بە ژنێکی ئورجیناڵە

دوێنێ من وشەی پۆڵام نەئەرانی

تۆ — ئەتوم

هەرگیز — ئەستەم بوو لە مێشکماندا

ئاخ — ئاوێنەی سکاڵا بوو

نەرم

نەرم ( سادە )

بمبوورە



ئیتر شێعرت بۆ ناتەقێمەوە

تا فرۆکە نەفرێ خەیاڵم بنزینی ئەوێ

- با خودا گوێی لێ نەبێ -

: ئەمشەو بۆ قاپێ کارەبا میوانی من

مەست مەست ( ڕوبوت )

-: ڕاستی بۆ ئاوەڵا کردنی چاکی سینەت

ئاچەری ژمارە چەندم پێویستە

ئیتر بە تاسەی ئەم تاوان — مە

خۆت لە خۆتا کەمێ ڕووت بۆم بڕوێ

تا بێژم لە هەرچی ئینسان و داستانی کلاسیکە

کەمێ ئەولاتر لە گەنم پۆڵا و پلاستیکە

ڕەنگەکان کوێرن

کوێرتر لە دیدە مەستی دراوسێ

[ بێ ڕەنگتر لە تەڵا کورێکی — مەسەلەن —

ئاشقە ]

من و تۆ

زەرد و زەرد

دەبوا وەنەوشەیی ببایین

وەکو خەونی شەیتان
ئاراستە بە ئۆخەیەکی پڕ لە هەوەس
بـــــەڵام خۆڵەمێشـــــی نـــــەبێ ئـــــیتر
ڕەنگیٚترمان...
دوێنێ شەو کە ئاسمان پڕ بوو لە ڕاستی
هیچ کەس ڕازێکی بۆ گێڕامەوە
بمبوورە دایکم بوو
- با مەنارە گوێی لیٚ نەبێ -
« جەژنی میلیۆن ساڵەی ئادەم  و شەیتان
بە قەد مەنارەکان مۆم
قاقـا و قیتـەقیت هەنـدێ پـەری کـامێرا بـە دەسـت هەنـدێ
چەپڵە....»

ئاخۆ کێ نازانێ سێو چ ڕەنگە و
کێ هەنار؟
من ئیتر هیچیان ناناسم
ئیتر لە بەهەشت ناگەم
ئەم سەرگەردانیمە خوا بزانێ چەند سەرگەردانە
بۆ دۆزەخێکی بەهاری
تاوان
باران
ئەرژێم



خوشکەکەم وەکو گریگەوار قۆلانجە ئەدوێ
- جەنابی کافکا خۆت خۆش کێیە کەر نەبێ -
ڕەنگە باوکم و ئاغای زامزا هاوزادی یەک بن

براکەیشم
هەموو شتێکی سەر لیٚ شێواوە و هیچ شتێکی/
بێ دەسەڵاتی من و دەسەڵات
خۆ دایکیشم ناناسی خانم!
تۆ لەم وڵات و خەباتە چیت خواردووە جگە لە جەرگی ئەم کوڕانە

لەوانەیە ئیتر نەڵێم ئاخ
تاوان لە کانیاو زوڵاڵترە
مەکین ئامان
جەستەی تابۆی من نەکەی نەیشکێنی
شارەکەمان توتەمی مەنارەیە
لەم هەموو باز بازە
مناڵبازی هەر بۆ ئێمە حەرامە و ئەم خاکە مناڵبازە

لە تەواو دا

گرەی ئازارێکی « مایکل » م پێیە رەشی رەش

لە ناخمایە بڕوانە

پایزی 2001 – جوانڕۆ



## ئاوازێ بۆ جنووبییەکانی زەوی

دوا ئاخر بوو

دەستمان پێکرد

ئێستاش ماوین تا سەرەتا چۆن بمرین

مەکین پاڵی داوە بە هەوەسەکانی تەنیاییمەوە و گوڵ ئەچنێ و لە
باخچەی خۆیدا ئارامە

: درەنگ نییە

من ناتوانم

کە دەرفەت بۆ درەنگیش لە توێی هەلا هەلای رۆحما

گیان ئەسپێرێ

کێ نالێت خەیراکە تا ئینسان ؟

کە باتلێ دەرفەتێ ناهێلێتەوە

بۆ سەفەر

باتلین

هەمووومان باتلین

بە هەناسە و پێکەنینیش/ هەر

وادەی گەڕانەوەمان کەس نازانێ چما فەوتانێکی رزگار کەر

[ تاران !

تکایە نەختێ لەو ژیانەی کە

تلەفیزیۆنەکەمان رەنگاو رەنگ

چاو ئەدزێ ]

چاوەکانی مەکین پاییز ئەدوێن

چاویلکەکەی سەخت زەردم ئەکا

من پاییزم

« با » ئاوام دەکاتەوە

مەکین ئەڵێ « من »

باوکم جنووبێکی دوور



دایکم ئاسمانێکی نزیک

کەس بەڵام جنووبی زەوی زەردی ناکا

مەگەر من و مەکین و یارانی ...

بۆ تەڕ بوون

بارن ئیتر کارم تێ ناکا

کە رۆژ چەورترە لە پەڕو باڵی باڵندەیەکی کۆچەری و

جێماو

زەلکاویش دڵگیرترە لە وەسوەسەی سەوزی فڕینێکی ئەبەدی

نازانم بۆ

هەمیشە ئاخر سەختە و

سەرەتایەکتر دەستناکەوێ بۆ قەرەبوودانی سبەی

کە هەبوونمان پرسیارێکەو

وەڵام لە قوڕ ماوە بۆ وتن

ئەم رۆژانە

بە تەمای سەرەتا هەنگاو ئەنێم بۆ هەر کوێ

هیچ جادەیەک پێی شەکەتم ناخوێنێتەوە

هیچ جادەیەک حیلەی ئەسپێکی یاس و یاخی ناگرێتە خۆ

] قددیسەکانی زەوی

تکایە چرکەیەک گوێبن

تەنیا

چرکەیەک

- خوا جەزای خەیرتان بداتەوە-

[

بۆ ئێمشەو

جگەرەیەکی کەمتر

گۆرانی بێژێکم دەستناکەوێ

راز راز بمرم لە گوێتانا ئازار

گوێ بن !

مەودای نێوان من و ئۆخەی تا خودا باڵا ئەکات و

تا تاریکی خۆم قووڵ

من و حەقیقەتێکی نەناسراو تا تاریکی کێ بەرکێ

من و مەرگێکی ئاسایی تا تاریکی هەمیشە

من و خودایەکی باو ...

( بە ئاسمان متمانەم نەماوە بڵێم هەتاو )

بۆ ئێوەمانان ئەم مەودایە لە نوختەش کەمترە

من بەڵام سێ نوختە

- لە کەسیش داوای لێبووردن ناکەم بۆ نوختەکانم



کە هەرگیز داوای لێبوردنی لە من نەکرد

وەهم و سێ نوختە ...

هەمیشە کەسێ هەیە رەشم بکات :

« شتێک نەماوە تا مەرگی چرا »

شتێ دەست ئەکەوێ چاوم خامۆش کات

لە مەشغەڵە دوورەکان

مەشغەڵە دوورەکانی خۆم

مەشغەڵە دوورەکانی لە خۆم دوورتر

کە ئینتزاری بەیانییەکی سەوزتر لە وەسوەسەم پێدەبەخشن

- شەقارتەیەک مەکین دایگیرسێنێ

دڵم نایە گڕم تێ بەرنەدا-

هەمیشە تاریکستان

رێگەیەکی هەیە بۆ خەون و کەوشەکانم

بەڵام لە من تاریکتر فریشتەیەکی شەرمنە

بە چڵکە شەقارتەیەکیش بێ ، لە پشتی چاویلکەکەی رووناکم دەکات

تا هەنگاوێ کە،

« شایەد

»

] ئەلۆ

چاویلکەکەت شکاوە

ئەلۆ
شەقارتەت پێ نەماوە
زەخمەگۆنات پێم بڵێ کێ لێی
داوە

ئەلۆ
بە خوا لە شینایی قەڵبی ئەم بەهارەدا
وەک تۆ نامۆم پێم بڵێ چی قەوماوە
ئەلۆ ئەلۆ ! ]

ئەم شێعرە پەریشانە
شەرابیم ئەکا
تەڕ دەنووسم
بارانی
ئیتر جگەرەیەک

بەهاری 2002



## فڕۆکە

لە نەبزی ئاسماندا
ئاسنی لێئەدا و
من لە بای بای
بێهوودەی منالێکا
سقووتم کرد
مشتێ چاوم
هەڵواسە بە تەنافێکا
نمە نمە
خەریکە ببمە باڵندە

**ناخوا !**

**ئەم مەسیرە ئاخر تەمەن تا سوور   زەردە**

لەوێ

زەوی وێران ئەبوو

من لە سەرەتای ئاسمانەوە دەستم پێکرد

لەوێ

کە بوونەوەرێ هەستی بە بوونی خۆی کرد و

نەیدەوێرا

لەوێ

کە منداڵێ — گوتم بە « با »

: برِۆ تا کوێ

هەناسە سواڵ ئەچێ



□

پەنجەکانم فێر بوون

قەرەبووی دەستم بدەنەوە

دەستەکانم/ قاچم

هەر دوو قاچم هیلاکی هەنگاوێ تا سەرەتا

ئەی نەگبەتترین [

بەرە !

لە قەرەبوو هەڵنەگریتا وێران

بە ]

من

هەرگیز  فریا نەکەوتم/

وێران بێمەوە

لە مردنا/ هەرگیز فریا

نەکەوتم

لە مەیانا

حەسارا

دانیشتم ئەمرد

لە بازاڕ و جادە رێ کردنم

لە خۆما بێ خۆما شتێ هەیە و ئەمرد

لە وێڕا بوو

تۆ – ش بووی بە موسافیری کەشک و باران

کە منداڵیٚ – وتت بە « با »

برِم تا کویٚ:

هە ناسە سواڵ ئەچیٚ

[ ئای! ئینسانی قیر و هەوا

پیٚچ و مۆرەکانت ژەنگ ئەچیٚ

[

□

ئیٚمە چووین بە پاس

سوپاس بۆ شۆفیری بەریٚز

هاتینەوە بە پاس

لەعنەت لە مەوداکان

ئیٚمە هەمان کورِ و کچی نەگبەتی جارانین

: ئاغای پۆلیس!

چرا سەوز ئەڵیٚ/

:

ئەم چوار ریٚیە تا کویٚ ناگاتە

مەیدان

ئیٚمە موسافیری کاولی

کەشک و بارانین

-: سەوز بیٚ سەوز



ئەم چواررِیٚیە تا سوور زەردەو

سپی مەمنووع!

□

کەچی سڵاومان فریٚ دایەبەر

هەر چییەک کە شتە !

سڵاو بۆ هەموو جریٚک تا جانەوەرانیٚ کە کەرن

گیان لە بەرد و بەردە وەر

سڵاو بۆ بۆقەکەی داروسیٚ...

: ئەی بۆ کویٚ ؟

هەور ئاوا ؟ تا فرِۆکە ؟

لە بیرت کرد لە رژانیٚکی

تەرِ و شیٚتانەدا

گەمەکەتان لە نیوەی ماقڵەدا

جیٚما؟

□

فرِۆکە لە نەبزی ئاسماندا ئاسنی لیئەداو

من لە بای بای بیٚهوودەی منالیٚکا

سقوطم کرد

[ فرِۆکەوانی

بەدبەخت !

نەختێ سەرتر

بۆشاییە ]

مەکین!
تۆ لە ژێر بارانا/
مەبارە
ئاسمان دەرەقەتی لافاو نایەت
با من
برژێم تا تەڕ
لە شەقاما
تاریک رابکشێم/ تا باڵات
بشۆڕێم
زەرد
زەرد
بچۆڕێی
تا سپی
□
: تاکسی !
: تاکسی ! من خۆم سوورە
دەربەست تا سپی چەندە تەمەن/ ئەبێ
زەرد بچین



- :ناخوا
ئەم مەسیرە ئاخر تەمەن تا سوور زەردە
با بڕوا منداڵی – ئێمە سەرمان تا حەوتە

[ مەرگینی سادە!
چاویلکەکەت تا کوێ
شەرم

ئەدزێ ]
وەرە
با بگەڕێینەوە/ هەتا کۆتر
ژمارەکان بۆ قسەکانمان کورتن
جادە لە وێرانیمانا بن بەست
ئاسمان لە $\pi r^2$ دا خۆی کاول ئەچێ
گوم دەبم و
دەبیت و تا ژەنگ
زەمان سەرفمان دەکات
[برمان تا کوێ

هەناسە سواڵ ئەچێ ]

پاییزی 2002 – جوانڕۆ

## یەکێ بوو

**یەکێ بوو    یانی  تا هەنارم شەراومکە**

مشتێ خراوم لێداکە
لە گەنمەوە
تا ژەنگ/
ئەم زەوینە درێژم
حەماڵی مێژوویەک ئەچم
یا لە مێژوویەک/

ئەچم
رێکی جادەیەک سوورو ئامریکا
پڕی نایناسمت سادەی
ڕاکە



: لە ژەنگەوە تا چی؟
خاک بە سەری مڕیخ
واز بێنە
دەرفەتێ تاسەرە تا هەنارێکە  هەر
شیرین ئەگەر نەبێ
هەر کەر
کۆکەنە هەر و چیتر

□

بازیکە
لە شوێنی پیاوێ کەوە
پڕی ئەم پیادەڕەوە
کچێ لە کەمەریا رێ ئەکا
: کێ لە کوێ و
هەنار کیلوی چەند ؟
ئەم رۆژانە
تۆپ تۆپانەو

هەنار یانی  دەروازە
شووتم کە
کەمێ خوارتر
پڕ بە خاڵیت خراومکە
تا گوڵ — گوڵ

□

لەو پەڕی سیمەکانەوە

لە متمانەی

لەتێ ئەگەر  هەنار و بورجی موخابرات

مەکین و  پەنجەکانی

لە چوار رەقەما

توانەتەوە

من

لە تەلەفونا ئەزرێم

: ئەلۆ پرم/  ئەمجارە چرایە و

« اللّه ارحم » الهنارين

- : چاویلکەکەت شکاوە فرە مەستی

مەمگرە هێشتا

خۆم مەشغوولٚ لێئەدا

دەنگێ کۆتاتر لە سیگار

لە سەرما سەفەر ئەکا

دەنگی لووسی چەندە ماعیر

لە گوێما  عەر عەر ئەکا

: ئامریکا کەی حەملە ئەکا ؟ و



کچێ:  ببەخشە !

نەختێ ئەو لاتر

غەرقی بۆنت سیگارە

-: خانم چی/ چیگار چیە ؟

من خۆم

حەفتا گار دووکەڵترە

ڕۆژ

ئەم ناشارە

تا شلووغیە شارەو

ناچار من قۆڵی

کراسەکەم ئەگرم

گوم نەبم / و

بۆنی سیگار

شەو

تا دوو

قرانیت

لە هەرچی

تەلەفوونی

پەنج تمەنیا

سووتی قەتارە

چمکی چارشێوەکەت

بەرنەدەی

حەیات

پیادە ئەبێ

□

بەشی کۆترێ

مشتێکم هەڵکە بە ئاسمانا

ئا وەکو ئاشق

بێ وەکوو باران

تێ پێ خێ باران

جێ جەهەننەم لە هەرچی کلیشە و بیست — ە

: چیٚ ؟

کچێ! ئەگەر پیاسەیەکی بێ چەتر

لەگەڵما

برژێ وەکو...

: وەکو تکا ئەکەم سەرما نەخۆی

چی و چی و بارانی چی؟

دایکیشم

کەمێکی تر نەسیحەت



پرم

ئەرژێ

کاکەیشم پڕە لە گەورەیی و باوکم/ :

ئامریکا کەی حەملە ئەکا ؟

شوکر بە مناڵی گیرفانم کون بوو

حەمەش/

لێوی لە سیگارێکا جارییە و

لە عەلامەت پرسیارێ — ئەچێ

: یا حەزرەتی شاعیر!

دوو نوختە دانێ بۆ ئەم

کورەش

تێری زەوی ئیستفراق بکات

:

بوون

یا

نەبوون

بوون و ژەهرە مار

□

مشتێ چاوم

هەڵواسە بە تەنافێکا

– نمە نمە خەریکە ببمە باڵندە –

یەکێ بوو/ یەکێ بوو
یانی
تا هەنارم شەراوم کە
تێری دڵم ئەگەر تۆی ...
: نە ؟
راوەستە چرای ئەم شارە گشتی سوورە
یەکێ بوو/ یەکێ نەو
لە دەمتا شەترەنج ئەکا و
من ئەسپم/
لە پشتی ئەم چرا سوورە
تەختی جادە سەکتە ئەچێ
تۆ لە تاقێکا بمرم
یانی
چوارشەمە لە تەقویما درۆزنە
ئەوە ئێستا تا تاقەت تاق بیەن
ئیشتیاقم پەروەندەی مەردوودیمە و
ئەم سەفەرە/
ئەگەر بێ ئاخرە



چەندە بێزارم لە مەلەکووت
وەک پڕە لە هەسارە

ئەترسم/
هەرچی پیاوی شەرقییە وەک
منیش/
ئەزانی بە بێ خاڵیش
ئەم هەنارە
پڕ بە باڵات درەختێکی گرتووە
متمانە بێهوودەترینە/ ؟
: ئا
ئا وەکوو باوکم
کە خوا بە یەک نوختەوە ئەبینێ
□
ئاسمان
لە دەستی کوڕێکا شۆڕە و باران
: کوێ لە کوێ و
هەنار مشتێ چەند ؟
ئەگەر هەنار یانی دوو تۆپی پڕ بە
دەست
خوایە!

ئاوێزانی گەرمی ئەم دەروازەمکە
تا
گوڵ

ا میخێ لە کەوشەکەی ڤلۆدیا
ئەم کوڕە پڕ ئەکات لە گوتە و ماریا
یا شێخ/
حەزرەتی هەر کێ و لە کوێ!
دۆعای ئەم کوڕە ببەیتە سەر گا
زەوی وەک
بەر لە گالیلە

□

بە من چی ئێوە لە سێ نوختەی لەشتانەوە سەرناکەون
من تا کەمێکی مەکین
سێوێکی دزێنییە کەمێکم/
لە سینەی تا ئایناسمێک — ئەگەر هەنار
لە دەستی باوکمایە چی ئەکا/ کەمێکم
میوە فرۆشێکی شیرینە
کەمێکیترم/
هەر کەس دۆزییەوە



لە بەرزی مەنارەیەکا
خاکرێژم بکاتە
خوار
ناشارداریتان خۆش!

: ئامریکا کەی حەملە ئەکا

□

یەکێ بوو
یانی
ئەگەر پیاسەی سەرزەمینێک بێ چەتر بڕ ئەکەی
ئە
ڕ
ژ
ێم
ئا ، وەک
فلووتێ لە چاوتا/
یانی
دیواری چین
چوارشەمە هەمیشە لێئەدا و
لە من ئەچێ/ ئەگەر
تاچی ؟
ئەم پیادەرەوە لە پێما سەرگەردانەوە

دوێنێ دەستم لە شێعرێکا جێما

پەنج شەممە ئاخری منە و

حەفتە/

ئەشێ نەزانی دوو ڕۆژە

پڕی ڕۆژێکی چوارشەممە شێعرە/ ئەگەر

لە دایک بووم

پەنج شەممە

بێهوودەترین

ڕۆژە/

ئەگەر بمرم

فلووتێ لە چاوتا

دیواری چین و چی؟

یانی

ئەگەر تا پیانۆ

تەنیا

هەر نوتێکی مابوو

کە بێ ئیحساس ئەچی و

مانتۆکەت پڕ ئەبێ لە پەنج شەممە و ...

نە :

تێ؛



تۆ ئەڵێی: « تەواو »

ئەگەر من شاعیری ئەم شێعرەم

ئەڵێم نا/ تەواو

پاییز 2002 جوانرۆ

## شەراوییەکانی کوڕێ لە لۆچی خۆرنشینی مانتۆیەکدا

... یا بڕۆ
ئێوارەتر لە دووری
لە خۆتەوە دوورییەکانت بژمێرە تا...
: لێگەڕێ!
ئەسڵەن تەواو/
بۆ تۆ تەعبیر نەکراوە
ئاخری ئەم حەقایەتە پەنجرەیەکی بێ
دیوارە

: شاعیرەکە
گلاراویت ئەچێ/
بەم کاروبارانا رومانتیکت خاڵییە



: ئەسڵەن رومانتیک گەمژەیە و
رومانتیکێکی‌تریش
: ئەی نیشتمان و...
: گریمان نیشتمان و هەموو شتێ
ماتیکیش سوورە
مەرگت چاکترە تا نیشتمان تۆ داخی بەی بە
سینەتا
: وەکو وەکو گوڵ بەرۆکێکی کچانە
: بەسە!
قسەیەک بکە لە بارەی هەوەسی
دەستەکانتەوە
وە/ نە وڵات
کە بڕێجار هەندە نەرمە
تاسەی شەهیدێکی/ ئەکرێ
سیگارێ/ ئارام بگری و
بێخەیاڵی شێعر و قاڵاو و/
کەماڵ
لەم سەفەرا نەمیادێنی

: ...
: کە بێدەنگی/ ئەڵێی

نوختە نوختە خۆت جاری ئەکەی بەم

دێڕا

: داخم بێت و پشیلە بشکێت

-: ئەوا پشیلە شکا ، چۆلەکە-م

- ! چیبکەم

بەم بەبرە کاغەزییانەوە

شۆڕشێ بەرپا بکەم چیبکەم

□

یا بڕۆ و

ئەبرۆکانی بە خۆرنشینی درەختێکەوە قاڵاوکە زەرد

مەترسە قاڵاو یانی قەفەسێکی خاڵی

ئەزانی دڵتەنگی ئەم خۆت و خۆمە

لە چوار شێوێ هەندە لە چوار ڕێیەکیشدا چەندە چراکانت سوورە

کە بێدەنگە/ ئەڵێی

هەڵووژەیەک بە پایزەوە ماوەتەوە

- ترشە کەس نایخوات -

□

جادە یان جادە؟

: ئەسڵەن جادە/

فەرقی ئەمە بوو مەسیرترین شەکەتە

: بەڵام جادە



ڕووداوێکی سەیرەو ڕێ ئەکەوێ

ئیتر تەواو

هەبوو نەبوو

جوانڕۆ حەجمی سەندەلییەکی زەرد بوو

یا چەندە بێزارم لە کێو

کە تۆ مەغرووری

□

لە بیرتە

ڕێکەوتم ڕێکەوتی 4 ی 4 ی ساڵی هێشتا هەر پشیلە ؛

( پاسێک ئەتلێتەوە وەک مشتێ دووری لە خەتی جادە/ یا

- بەبرێ دەمارەکانمی داگرتووە -

پەنجەرەیەک کە ڕێ ئەکا و/ ناکا و

پیاوێکی شۆڕ ئەڵڵا ئەکا کەمێکیش لە مەڵلا ئەکا :

قەزات ماڵەکەم لە سەر خۆت

جادە بارانەو کۆزێ خێزانم

چیبکەم

پەنجەرە جاری ئەبێ

بە ماڵئاواییەک لە گەرووی ترمیناڵەوە

– بەبرێکم نەعرە پێیە –

شارام هەراسانە

با و با و

پەنجەرە

هەی ئەکەن

وەی ئەکەن

تابلۆکان

جادە

تەی

ئەکەن )

دایکم چارەیەکی چارشێو ڕەشە و ئاسمانی دابوو بە سەریا

هێشتا لەتێ مانگە شەو بوو ئەگریا

دایکە ئیتر

ڕۆژی پەنج جار دەستی بە بارمتە ئەداتە ئاسمان و هەرچی شێخە و

مێخە و

سەد جار

من و

منالەکانی ئەژمێرێ

نازانم دۆعای شێخ گیراترە یا

گوێ بدە بەم شێعرە

« نەمدیت



بە لاما تێپەریت و نەمدیت

ئاسمان بە سەرتەوە شین بوو

خۆ نەمدیت

چارەیەکی چارشێو ڕەش بووی

ئاسمان هەلواسرا بوو بە چاوتا

دەریا بووی/ ئەسلەن

جەهەننەم کە تۆش

منت نەدی

بە سە ئیتر

تاقەتی ڕومانتیکم چوو

بە سەر شکۆفەکانی گێلاس و جوانرۆ دا

تۆ خۆت و خوات

– هەلووژە ترشە کێ ئەیخوات –

منیش بە ئومێدی دیوار

ڕۆژێ لەم گەلاوێژانەدا

ئەشێ مەرگێ بە جادەقەرزار بم ... »

□

کە هێشتا ئەبارێ

– بەبرێ لە خاترما هەراسانە –

خەو لە چاوما قەتیسراوە و من لە خەو/ یا
ڕۆژنامە پیاوێکی داگرتووە
شارام گۆرانی هەراسان بێژێکە و :
« شەرتم شەرتێوەن
مەجنوون شەرت کەردەن
لەیلی من تۆ/ نیت ... »

[ چارەیەکی چارشێو ڕەش
پڕاوپڕ قاڵاوێ ئەفرێ
کاغەزێکی نووسراوە بە دەم باوەیە :
« جوانڕۆ قەفەسێکەو هەڵووژە ئەبارێ »

ژنێ کەوشەکانی بە شوێنما جێماوە و ئەگری:
هەر ئەم کوڕەم بوو
ئەم کوڕە
بەبرێ بە دواما وەیلانە
کەس بێگانەیە
زەوی
دەم
ئەکاتەوە
نازانم ، تاریکە ... ]
: ئاغا !



ئاغا هەستە گەیشتین

□
تاریکە
– بەبرێ لە خاترما وەیلانە –
تابلۆیەک جێماوە

تەواوی غوربەتراوە ترمیناڵ
باران هێشتا تێئەکاو جادە خەمێکی پێیە بیڵێ وەک دوور
چارەیەکی چارشێو ڕەش دەستی پڕە لە تەمەننا و تەڕ
بۆ خاتری هەرچی خاترە و جوانیت خەیرێکم:
پێبسپێرە
: ببوورە خانم « ئێمە فەراموشمان کردووە کە
فەرامۆشمان کردووە »

□
کۆڕێکی قاوەوانی گەرمی پیاوە و دووکەڵ
: ئەسڵەن تاوانی ژن مەمکە ...
: خۆ خوا ژناندوویەتی ...
: ئەم قسانە وەسە ئەوساو کچ
نازانم بۆ هێشتا شوورەییە؟
: راستی کچ خۆشترە یا نیشتمان؟
: نیشتمان مەسەلەن

ئەگەر کچ نەبێ کەی

ئەدرەختێ...

کچیش شەهیدێکە و

لە هەوەسی نیشتمانی پیاوئاوی دا

لە خەڵتانی خوێنا خەڵەتا...

□

ئێستا ئەسپێکم لە بەر کردووە و

شەراوییەکانم بە سەر ویترینەکانا ئەحیلێنم و دڵم حەجمی چەند

هەنارێ لێئەدا

کە — وتم:

« لەو دیوی چوارشێوەکەتا چارەم کە

وڵات وەک لە خۆتا چوارپارەم کە »

خانم!

ئیتر تەواو

با لە قژت بروێ زەرد

وەک هەورێشم/

لە هەناسەی شاعیرێکا

کەماڵ وەک ئێستا ئوتاقێکە

لە پشتی مومەیزێکدا بێمەعنییە

با لە قژت بدوێ/



کەماڵ سەرشاری تینووە

کت و پڕ پەنجەرەیەکە و

با بازیکا

یا بازیکا

ئەم رۆژانە سەر و ماڵم ناشوێنێکی شەکەتە و رامخستووە بە سەر

شەقامەکانی

ترافیک و ئەیدز

سەرەڕای خۆم و هەر چیم نەووت

خۆ وتم/ :

ئومێدم تەنیا دیوارە

کەماڵ تەنیا دێرێکەو

فیکر بە سەریا ژان ئەکا

بێزارە لە پشیلە و تامی هەڵووژەیەک

ئەدوێ

وەک بێوەری

مەپرسە، هەنارێکی بێ درەختە

شتێ کە فەرق ئەکا منم هەر

کە درەختم

:تۆ بڵێی پشیلە بشکێ

:ئەوا شکا چی گەرەنتی ئەم بەبرانە گورگ نەبن

□

قوربان !

سێو داکەوت نەهاتی

لیمۆ زەردە

بۆ/نەهاتی

ئەم باخە بوو بە ئاپارتمانێکی چوار تەبەق

لە چوار و چواررێ و پشیلەش بێزارم هەر

سێ؛

هێشتا قاوە دەخۆن و دووکەڵ ئەڵێن

دوو؛

دوو بە دوو ئەمرن و نوقمی گەرمی و نەرمن

یەک؛

وەک خوا هەمیشە بەرەو جنووبن

جنووبن هەر

ئەگەر بێیتە دەرێ

راستەو خۆی ئەم شەقامە

پرد خیانەتێکە

شەقام بە پیادەرەو _ا _ی ئەکات

: رێگەی ئەمبەر رێگەی ئەو بەر کوڵوانەکەی کوڵی

کێ



لەم قیر و قورڕو ترافیکەدا خانم کێ هەڵووژە

ئەخوات؟

: هەی فڵانی!

تەواوی ئەم شەقامە کە ئەڵێی/

لە حەجمێکی ناشوێنا ئارام

ئەگری

دڵم تەنگە

نە وەک خونچە

وەک کووچە

ئەی لە بەختم کە خۆت و مێشک

و

کووچەتان بن بەستە/

دەمی تۆ

وەسە بەرد لە بەردێ بێتەوە

ئیتر تەواو

من فەرامۆشم کردووە کە فەرامۆشم کردووە

باوکم با دۆعا بکات/ هەر

فرۆکەیە و زەرب ئەهێنێتە سەر ئاسمانا سپی

□

کوڕێ هەیە وەیزارێ لە چاویا ئەبارێ
خەریک بوو ئەیوت و لەبەر خۆی بمرێ
: دوو و دوو ئەشێ شێعرێ جەم بکاتەوە
نەکاتەوە جەهەننەم
گرنگ سیگارە دووکەڵ و ساندویجێکی تر

دەستی ئاوێزانی خەیاڵی هەنارێکەو چاوی لە سەر پۆشێکدا گیان ئەدات
ئێژێ ئەم شێعرە هی کەماڵ — ـە:
« من ئەڵێم سەفەر بووکی گەڕانەوەیە
تۆ ئەڵێی ئەگەر دەستەکانمان وێران بن
کێ بەڵێن ئەدا سبەی قیامەت نەبێ؟ »
: درۆیە کێ ئەڵێ ئەم کەماڵ–ە هی شێعرە
تا من بزانم ئەمە شێعری کەماڵ بوو کە بوو
ئێتر کوجا مەرحەبا رومانتیک تا ئوتوبان و ئەڵێن خوا گەورەیە

□

من خەونم دی



شەراوییەکانی کوڕێ لە لۆچی خۆرنشینی مانتۆیەکدا ئەمرێ
خۆمم دی کە تەنانەت خوداحافیزییەکم لە کەماڵ نەکردو
دوورییەکانم تا جادە و ئاپارتمان:
یەک: وەک خوا غەریب شوێنێکی ناشوێنە
دوو: ئەگەر بارانە ئاو هەر ئاوە و پیاو هەر پیاو
سێ: لە بۆشاییەکی نەرمدا خاتری پیاوێک سەرگەردانە
پەنج: لە چوار و چوارڕێ و پشیلە بێزارم
شەش: زوانی دایکم لە مەدرەسەدا جێما
حەوت: کێو و حەوت کەژ کەوتووەتە بەینمان ئیتر هەنار چی هەڵووژە!؟
هەشت: بەبرێ لە خوێنما خەوتووە تا ئەم شێعرە ئەبێ چاکنووس بکەم بۆ رۆژنامە
هەشتا: بێچارە دایکم هەندە دایکە پیر بووە
سەد: تا ئەبەد ناگا بە مەقسەد، کورت هەر کورتە مەگەر باڵا بکا
و ئاڵا بکا و شتێکی تر بنووسرێ
سێو وەک جگە لە سوور

ئێستا کەماڵ مەیخۆشەو
شەراو سەرخۆش
تا بزانی
وەک پایزو هەڵووژە
ئەرێ تۆش تەواو بوویت
پێچەوانەی ئەم شیعرە

2003 – سنە



شۆخی شۆخی سێوین و

## جیددیتر گەنیو

نا فەلسەفە و
بێگومان
دونیا گەنیوتر
لە سێوێکەوە دەستی پێکرد
کە تاوان بوو
بە سێوێکیشەوە بەردەوام گەنی
کە کەوتە سەر پیاوێک

## درەخت ئەڵێی
## زەمانی ئەسپەو چای

کە ئەڵێی- : -

منیش خۆرنشینەکانی ئۆتوبان

لە

تم

ئەکا بە سەر هەرچی پرتەقاڵی مەمکی

یارمە

وەک ئەڵێن/:

« ئاوەدان ئەو پاییزانە[11] بە هەناسەکانی یارما چوو

»

11- پاییز تاقەتێکی زەرد بوو لە ناشوێنی کورپێکا داوەری وەک بێتاقەتی مانگ



داخم ئەسپ[4] چۆنە

کە من شێتی جادەم

یا پەپوولەیەک بنووسم کلیشە ئەبم

رەنگتر لە نارنجی[8]

قەپ لێ دارو

مانگ ئەڵێم

ئیمشەو تا بزانی هێشتا شاعیرم[18]

نەمتوانی

هەرگیز لە چی شێعرێکا

ئەوە بی کە خۆت بڵێم

یا ئەوە بم کە خۆم بڵێن/:

4- ئەسپ ئەشێ حاڵەتێک بێ لە کاغەز، ساعات 4و 30 دەقیقە روویدا و زەوی لە بەر چاوما رووت بووەوە

8- خەیاڵی پیاوێک مەیلۆ نەرم و ئاستانەی باڵندە شێدارتر لە هەناسەی دەمەو ماچی پارک وەک ترسێکی سەوز

18- ئەرژێمە ناو خۆمەوە، مشتێ شێتی لە کەللەما ئەڕوێ و کەس لە کەسێکما ئەرژێ ئیتر چ پێویست قژم شۆڕ کەم پەنجەکانم بە

سـەر یەکـدا دائـەوەرێن پـاییزتر لەشـێت هاوتـەریبی بـا برێجـار
ئەوەندە ئەمرم هیچ شێعرێک نازانم بنووسم  چۆن...

: شاعیر بوون دەرفەتێکە بۆ دەفتەر

: من ئەڵێم دەرفەتێکە لە ژوورێکا

: ئەسڵەن ئەم رۆژانە مەسخەرەیە لە
مەسخەرەیەکا

: ...[5]

رۆژانێکە وتەیەکی سەیرم[1] بە سەر پیادەرۆەکانا راخستووە...

: یا ئەگەر لووسێکی پشی چاو پێشێلی
نەکا

: یا نەکا رازێک وەک مردن لە منا
بدرکێ

: یا مەکین کە تەواوی باشوور لە باوەشیا
بوو

نگەرانم
هیچ کچە نارنجێکی دەم بە پەیوولە و ماتیک
دوو- ی بە دووی چواردا ئەمرێ و من لە چوار دا هێشتا نەبووم بە
یەک[4]



1- هەست ئەچم خۆم – ێتر لە خۆما – ئەخواتەوە تا من یا خۆت
دێی لە منا ئەخۆێتەوە تا خۆم [ یا چۆنتان پێ خۆشە وایە    ]
راستییەکەی من نازانم چەن کەسە لە کەسێکما

5 – خۆت قازی  لەم با و بازاڕەدا سەیر نییە دەمم پڕ بێ لە هەوای
تەڕ و نەرم ببمەوە لە شێعرێکا هەر تەقێکەو لە تووقێ بدا فرە
موزجیکە بەم پیادەرەوا چوارشەمەیەک دانێم

4 – واتە مەسیرێک یەک لاتر – ئێوە بگرن مەرگ – یانی
حەرکەتێکی بەرابەر لە گەڵ پێش نوتفە بەڵام من ناشوێنێک تر
ئەناسم ئەڵێن رۆح :
رۆح؟

- تۆ وەرە با ببین بە یەکتر -
چی ئەزانێ ئەڵێم:
مانتۆکەت زەرد ئەدوێ
قەنارییەک وەک ناتوانی مەڵێ
: ئاغا نەخۆشی یا نە/ خۆش
: نە/ خۆشم بگرە مەیخۆشی هەنارم گرتووە یا
تاعوون
تۆ  قەپۆزت قورسە بە نیگاما « و یمنعون الماعون
» !
کچی [20] با

کچی باش
کچی باشوور و شوورەیی و سروودی کاوڵییەکانی بێدیوارو
پەنجەرەو
هێشتا خەیاڵی باخچەو ترس و پرس
پڕ بە تاقەتی شەقامێ ترافیک و تەنگی کۆڵانی ئەیدز
ئیتر ساندوویچ دەستی پێکردووەو
ئێوارەکان درۆزنن کە پیادەرۆ دائەگرن و وەک ئەوسا دائەبەزن

20- ئێرە پڕ بە هەوا بەرێکە شارێکە شەقامێ کۆڵانێ ماڵێ و سووچێکە و کچێک بەرەو پەنجەرە کە حیکایەتی شکایەتێکە لە دیوار ڕەوایەتی حیکایەتێکە لە دڵتەنگیی کچێک دڵی ئەوەندە بەحرێکە لێوی لە ماسییەکدا خەونەکانی ناڵێتەوە بۆ دیوار پاڵی داوەتە لەززەتەکانی شەقام و ترسێکی گەرم لە ڕەنگی قاڵی و قۆڕیو قیامەت

درەخت ئەڵێ - : -
زەمانی ئەسپە و چای
ئەمبەر
هەناسەی هەڵووژەیەک ئێستا
لە ئاستانەی ئەسپ و سپیدارا



هەر جەماڵە کۆم کۆمێ فاتمەیەکی پێیە و نازانێ چۆن
بینووسێ
فاتمەش ئەژمێرێ
یەک تا یەک و یەکتر
برِی هیچ ژمارەیەکی تر ناچێ
ناشێ تۆش نەچی؟
: من کوڕێ نازانم تا بزانم
- : بەڵام تۆ لە سەد دەرسەدی منا پەنجا پەنجای
جەماڵ وەک هێشتا نازانێ چا بخوات یا قاوە
یا ئەو پیاوە
خەیاڵی مەمکێ لە دەستیا پیر بووە و
پاڵی داوە بە عەکسی نیشتمانێکی $\frac{1}{4}$ م - مەمرە
بەهارە —
پاڵی داوە بە شەهوەتەکانی شەهید و ژن - خەیارە -
پاڵی داوە بە پاڵی خۆیەوە

[ بێچارە ئێمە
لە سەرەتاکانی کۆتاییدا هەنارین[8] ]

ئەمجارەیان بنووسە دیوار[5]

کەماڵ ئەبینی پەنجەکانی پەنجەرەی لێ ئەتکێ و هەناسەی پیاسە
ئەکات
لە کووچەی شێعردا
یا بمرم بۆ هەرچی لۆچی ژێر چاوتە
کە نەرم ئەبیت
نەرمتر لە خەیاڵ و ماڵ و مناڵی و نانی گەرمی دەستی دایکم و
رادیۆ دەنگی ئیسرائیل و
باوکم[1] / :
فایدەی چییە زەوی خەریکە تەواو ئەبێت

8- یانی زەوی جیددی بگری لە تاقەتی نیوەرۆیەکی تەمبەڵتر لە حەسار کە ترسێکی بە تەنافەوە ئاوێزانە

5- نازانم ئەگەر دیوار نەبوو پەنجەرە بە کام لا پاییزی ئەنووسی بۆ قاڵی

1- تا دێ گوڵەکانی پیرتر ئەبن ژوور هەر ژوورە و فەرامۆشی درێژەی ئەم حەسارەیە بێ گومان پێش لەززەتی باوکم ئەم قاڵییە خاترەیەکی پێ نییە بۆ بوون — م - [ تەنانەت نیشتمان ]

:- باوکە !



تۆ لە زەویدا بووی یا زەوی بە کام بارا
: تا من بیرم بێ زەوی هەر بووە
- : ئەی تا بووە تۆ چیت بیر دێ
: ...
- : بێژی لە مردنا زەوی خامۆشە لە منا
( کڵاوەکەی ئەکاتە سەر و کتوپڕ قیامەت ناکەوێتە بەر چاوی )
- : یا خوا هیدایەتمان کەی بە رێی راستا !
- : باوکە
راست بۆ چەپ نیە و چەپ مەگەر دوو دەست نییە
ئەی دیوار مەسەڵەن بۆ ناڵێن پەنجەرە مەگەر گوناهە
ئەی ئەم هەموو هەسارە...
( دایکم ماچم ئەکا و مێخەک ئەرژێتە ناوسەرم )
: رۆڵە مەدرەسەکەت ساعات ... جێنەمێنی
- : دایکە مەدرەسەکەم فرە فارسییە آب [ وشکە ]
□
( ئاخ دایکم[1] )

1- پەروین ئەڵێ ئێمە رووداوێکی پڕ حەیرەت بووین بۆ دایک رووتی رووت ئەترسم نیشتمانیش تەوەهۆمی دایک بێت بێ حەیرەت هەر

ئەم ڕۆژانە دڵم ڕەیحانەی گرتووە
کۆتەکەم هەوای پەروانەی گرتووە
– نایناسی؟!
کلاسیکە هێشتا و دەریا لە بەر ئەکا
– ئەڵێ کەماڵ –
هەزار پەپوولە لە قژیا لانە ئەکا
شوکر باشە ئەم بەینە نەبێ بۆ من بەهانەی گرتووە

ئیتر بێزارم لە ئەوان و ئەوانیتر
چون ناچارن ناچار بن
بەڵام دایکم هەر مناڵم
: تۆ چی؟
– : من هیچ
: ئەی تۆ؟
– : من پلاستیک[0]
: ئەی تۆ؟ من نیشتمان
: ئەی من؟ من بە خوا نیشتمانم کە پەشیمانم[4]

4– ئێستا کە ئەڵێم نیشتمانم کە پەشیمانم بەو مانایە نییە کە هەیە بەڵکو بەو مانایەیە کە نییە واتا باڵ بە ئاسمانەوە بگری درەخت زەمەنێکە بۆ تاقەتی گەڵا



0– ئەگینا بەو لاکەیتردا پلاستیک تاقەتی لاوێکە بێ دڵەراوکێی درەخت و بە شەقامەوە ئەشەلێ

شێواوم تەواو
سەد کووچە هەر کام لە شارێ بەم هەنارا کە ئەونەی دڵمە
سێوێکم بەسە

بەسە !
تۆ سێوێ
یا من لەتم بەسەرکوڕەکانی گەڕەک و دەرەک وکچەکانی ئەگەرو ئاگر؟[20]
ئەم تەقدیرەم داناوە بۆ باران – تا بڵێن کلیشەیە —
ناقۆمێ هیچ ئەگەر ئەم جارە بێ تۆ
پیادەڕۆەکان دەست پێدەکەن دووبارە بێتۆ/
ئەرۆم مەیلۆ خۆرنشینی ئوتوبانی بەخت و درەخت
– بڕۆ جەهەننەم –
نەرمێک هەیە هەنارتر لە هەنارە بێ تۆ
هیچ ڕووداوێ ناشێ ڕوو بدات بۆ من
– براکانت خۆش خانم –
« نەمردم من ئەگەر ئەمجارە بێ تۆ »[8]

20- کوڕەکـانی ئـەم شـەقامە وەیلانـی شـەون و کچـەکانی ئەگـەر
ترسێکی زەرد لە دەم و چاویانا مانگە باوەڕکە مانگـتر وەنە
تابلۆیـەک کـە پێویسـتی بـە دیـوار نییـە هەراسـان لـە ئاسمانـا
پەنجەرەیەک پێویستی حەسارەکەمانە کە نیمانە
8 – بێ تۆ چەندە شاعیر بم ترسێکی نەرمم لە پیادەرۆێکدا نەمرم
کە مردم کراسێ لە بەر کە هاوقەتاری ئاو

□

بێ من
ترسی دوورێک
لە قاپێکا بگری
– من گریانەکانم لە مناڵیما جێهێشت –
یا وەرە
پەنجەرەیەک بمخوێنەوە
لە دیوارتا دایکوتە
ئەمجارەیان بنووسە:
دڵتەنگی
ئەوەندە بنووسە دڵتەنگی
تا چیبم جگە لە ماسی بۆت بگریم لە حەوزێکا مناڵیم

پەروین
سێو و ماڵم لە تۆیە خرتە زەوی



سەیرم کە چۆن درێخی دەریام دەریام
من لە نەهایەتی بێهوودەییا
گرەی دەریایەکم لە بەر کردووە
ئاو تا ئاو[20] و

20 – ئاو ڕەمزێکە بۆ ئاو دەریا ترسێکی عەجیبە هاو تەریبی دوور
دوورتر

نیشانی نیشانێک ئەپرسم[4] وەیلان
لە ویترین و ڕۆژنامە و بلیتی پاس و هەرچی چیە درۆ یان ڕاست

شەقام بۆنی ئەیدز ئەدا و خۆی داوەتە دەرخواردی ڕەگەکانم
پیاو کە لە شێعردا بتوێتەوە وایە! ( : چۆنە؟ : وایە ! )[9]
بوون برێ جار ساندویچێکە، برێ جار بۆ بیری لێبکەمەوە
تاکسی بەردەوامە لە سەر تاکسی بوون
ئەم شارە تەواو ئەبێ ئەم کچانە هەر نابن بە پیاو
خوا – هیچی پێ ناکرێ مەگەر خوا بێ

زستانی 2005 - سنە

4- : ئاغـا   ناونیشـانی نیشـتمانێکم پێویسـتە   سـێو   بـێ ئـەنفال و مـەنفال   دەریایـەکیش خـاکی پـێ بشـۆرمەوە    چـەن پـارکێکیش شەهیدی پێ بشارمەوە   ژنێکیش ئۆرجیناڵتر لە دەریا  ئەمبەر  تا ئەمپەڕ  پرتەقاڵ

9- شاعیر شێتە کە شێتە

ناوی ئەم شێعرە پەراوێزی حاڵەتەکانی ترسە لە ئەسپ دا



...

- براکانم خوشکەکانم —

ئەم خاکە بێ سێ و دوو لە هەرچی سوورە و دوورە هیلاکە

لە تاکسی[8] تا ئەو بێوەژنانە کە خاترەی پیاوێکی سوورترن لە

موسافیر

ئیتر

دەستم پڕە لە هار و هاجی و

پێویستی بە نەرمە  کە  غەڵتانیکەی  لە گەرما

8- وەسە سوور   دایەرەیەکی پیرە تاکسی و   حیکایەتی چراکان لـە کارەسـاتی شـەقامدا خـامۆش ئـەکات   تکایـە هەرکـەس تـا ئـەم شـێعرەی  شـێعرە  جادەیـەکی نـەرم باشـترە یـا هـیچ نـەبێ ببـێ بـە هێلێکی ئارام وەک:

- راستی ئەویٚ چۆناوچۆنە-

ئێرە   سیٚ شەممەیە [7]

تەعتیلترین شوێنی شیعرو شەهیدو ئاوارەیی شەقام لە پیاسەی

پیاوێکی خەڵوەت

بە پیادەرەو و  ئەبرۆی ژنیٚ کە  دوور  ئەفڕیٚ/

باوەڕ مەکە

ئەم هەتیوە بیٚباوکترە لەوەی ئێمە بکات بە پیاو

( تکایە پیازیٚ پاکـکە و تێر تێر بگری بۆ ئەم

پیاوە )

سیٚ شەممەیە [77]

- بارانە و رەنگە قوڕ هەمان رومانتیکە -

خانمیٚ!

تۆ بێدەنگی نیگاکانت کۆکەرەوە

شەقام چەپ و راست پڕە لە هۆڕێنی ئوتۆمۆبیل و

سووتی پۆلیس و سەرو خوار ئاوی لیٚ ئەرژیٚ

( سەد ئەوەندەش شاعیر بیت گیان بیمە

ناکرێتەوە بۆت )

بە هەموو بەخت و تەختێکەوە

ئێرانە وێرانە بە بەرمانا



7- لەم شیعرەدا سیٚشەممە  ئێرەیەکی ئێوارەییە لە قەوارەی فەرامۆشیدا  شەقامەکانی شاعیریم  ئەمریٚ  کۆڵانەکانی عاشقیم ماڵەکانی پرمەکانی ژنەکەم  غوربەتی لیٚ ئەچۆڕیٚ  درەخت لە هەناسەی کەسێکدا شک نابەم سیٚشەممە

77- دەستم خاڵی ئەبیٚ لە وتن و بە مەشتیٚ مەرگەوە سەرقاڵی پیادەرۆەکانم و رۆژنامە کە ئەنفالی کوشتووە

بارانییەکی شۆڕ هەیهوو بەهاریٚ زەحمەتە

ئەگەر دەربەستی دەربەست- یش

چاوی چەپت جاروبار

ترافیک — ە — باشترین مردنە بۆ کات و بیرکردنەوە؛

( داخم فەریدە چەند بێوەرەو بێوەژن و — سەر وتاری رۆژنامەی ئەمرۆ ئەنفا— ∞ لە باخچەکەدا گێلاس بمرین باشترە بۆ خواردنی شەو داخم پڵاو خۆشە - ؟ - بەشەر بزانیٚ مەرگ چۆن مەرگە — بیٚ تاکسی چەن دوورە هەینی— ئاڵاکەمان هەڵئەکریٚ لە خ اترەیەکی تەعتیلدا — هەڵبەت کالباس خێراتر ئامادە ئەبیٚ — راستیی فەریدە ...)

رێکەوە و پێکەنە

یان

پێکەنەو جا رێکەوە

پێکەنە بە هەرچی پێکەنینە[15] بە پێکەنینی گەدا – ش

∞ – ئەنفال:

..................................................................

............

..................................................................

...........................

..................................................................

..................................................................

.. و ... ( ئێوە شاعیرتر – چی ئەتوانن بمرن بنووسن )

15 – سێحرێکی مەجهوول بە ئارەزووی مەحکوومێکەوە ئەچێ هەر ئەچێ تا...

نە – سێحرێکی مەجهوول لە ئارەزووی مەحکوومێک ئەچێ

نە – ئەسڵەن ئەڵێم پێکەنین یانی فەرامۆش کردن

من لێرە لە خۆم و بێخۆما خەریکە هەموو شتێ بمبا تەنانەت ((با))ش

بەڵام تۆ نەکەی نەمیادێنی

لە رۆژنامەیەکا بمخوێنەوە، لە وتارێکا ،شێعرێکا یا خۆ لە پەیامێکی سەرەخۆشی

ئەگینا ئەم شەقامە درێژە پڕ ئەکەم لە جنێو و جەنازەی خۆم

☐

چرا سوورە



خۆ نازانی تاکسی چەندە ئازارە بۆ پێڵاو

یاکاتێ ئەم لاولات دوو پیاوی قەڵەوە گۆرانییەکیش هەسانی مێشکتە؛ ئەم لان و ئەو لانم کە تۆ وەرە دەس لە (( هەرچیشتە بشۆم بەم هەموو باوکە چکۆلە شۆڕشێ بەرپا بکەم چیبکەم ئەگەر ئەم کڵاوە بۆ سەرم دوورە، دوورە/ یا نزیک لە بیرم ناچێ شەهیدەکانی ئەمان شەهیدەکانی ئەمانیتریان فت کرد هیچ نەبێ بەم پشیلەوە سەرگەردانی ))بۆ خۆی دەچێ ...

سقوانم وەختە دەرپەڕێ

ئاسمان رەنگی دەستی کورێکە و هاوار ئەکا

تەواوی پیادەرۆ شووتی ئەفرۆشێ

قارەمانی پۆلیسێ لە باخچەی دزێکا گوڵی گرتووە

شەقام ئەقیژێنێ

چەترەکان رێ ئەکوژن

ئامبولانسێ هاکە بمرێ

( خۆت خۆش سێشەمە

بە هەموو شەمەکان و مەمەکانتەوە )

☐

سەوزە!

سیمای شێتیت لە بەر چاوما

لەم درەختانە پێچەوانەتر ئەچن

برێ جار لە چۆلەکە و

هەمیشە لە دەریا
کە سەیرم ئەکەی سەیر ئەبیت
ژنێک پڕ لە جریوە و شەپۆل و شێعر
یا نیشتمانێکی لەت و پەت لە تاقەتما
ئێرە دائەبەزم — ئاغا —
– ماڵەکەم! ژوورێکە خەڵوەت بۆ تاقەتی شێعرو بێ حەسارێک
چۆلەکە –

راستی بیستووتە وڵات ئەیوت
ببوورە خاکی بەستەزمان چی؟
پیاوانی کەڵەگەتی تیتری رۆژنامە:
شەهید[4] پێویستە بۆ مردن
– براکانم خوشکەکانم دانیشن بەستەنییەکەتان
پێکەنن –

4 – موسافیر رووداوێک بوو لە زەینی کێو دا تا خەتەر جادەی نووسی شەهید ئێستا ناوێکە برێجار پرۆگرامێک هەمیشە خەمێکی ساردە بە دەم دایکێکەوە ئەڵێ : زەرەری کرد کە زەرەرم کرد پاییز کە درەختەکان رووت بکاتەوە کێی تر بە خشپەی گەڵاکانەوە پارکێکی عاشق روو بدا یا کێی تر شەوێکی رووت پێخەفەکە ماتەڵ بکات لە نەرم



راستییەکەی من لە خۆم و ئەم خاکە گومانم کردووە
چیترە زیاتر لە خاک[1] کە فەلسەفەی ناوێ هەر خاکە
خۆم لە خەڵوەتێکا شلووغ ئەکەم
ئەم چی یانە — یانی چی؟ کامە درۆیە یا کام درۆتر؟
راکەم بە پەنجەرەیەکا
ئەم ساڵانە ئامریکا پڕە لە دومکراسی و هەرەشە
لەم نان و قەزوانە زەوی وەختە بجووڵێ
داکەوە:
(باوکم ئەیوت )
لەتێکت بە سەر پەتێکەوە جێئەمێنێ
(چاوی لە ژێر لۆچی ئەبرۆی ئەبووە دوو نوختە )
: ئەم سیاسەتە سی یان سەدە کەی پیاوە مێژوو

□
ساعات یەک و لەتێ/
مانگ رژاوەتە ناو فنجانێک قاوە
بڕیارە بەرەو بێخەوییەکی درێژ، درێژ ببمەوە و شێعرێکی تر
ئەنووسم/:

1 – لە لەپی منالیما بێگوناحییەکانی دەستم لە کایەکانی خاکدا ون بوو دایکم کولوانەکەی ئەوەندە جوانە تەنیا چۆلەکەکانی پێ

گوناح بووم  تا لە پرێکا پیاویان کردم   لە پێما سەرگەردان ئەبم
خاک زەوی تا زەوی گوناحم ئەکات

«پەنجەرەیەک
بوو بە دارەمەیتی هەتاو
لەتێ مانگ لە شووشەیەکدا قاپ کرا

تەنیایی
شاعیرێ سووک و سپی بوو بە
جگەرەیەکی
گیرساو
فڕی بەرەو پەنجەرەیەک »
یا دەروازەکانی دونیا
چەند بفڕی
ئاو لە ئاو ناجووڵێ مەملەکەت
ئێمە لە پاپ دو نکیشۆتترین[9] خانمێ
ئەگەر ئیمان و ئەم لەتە نیشتمانە نەبوو
– دایکم من و منداڵەکانی شەرتە هەر –

تۆ خۆت بە چییەوە خەریک ئەکرد؟
: بە پیاو و پیاز



9 – وەک شاعیرێکی چێوی   تەنیا دەرەقەتی شەکری قاوەکەم
خەیاڵێکی شیرینە وەک شێعرێک

ئەی فەریدەی بێوەژن ؟
: بە پیاو و پیاز
ئەی دایکی ئەو شەهیدە[3] کە پێی وایە راستە ؟
: بە پیاو و پیاز
ئامریکا؟
: بە پیاو و پیاز
ئەی پیاو؟
: پیاو پێڵاوێکە خەیاڵ پڵاو باوەڕکە!
چی باوەڕکەم؟
: ئەسڵەن پلاستیک! کوا جادە ئیتر تەحەمولە[2]
شۆخی شۆخی سێوین و جدی تر گەنیو/
نا فەلسەفە و بێ‌گومان، دونیا گەنیوتر –لە سێویکەوە دەستی پێکرد
کە تاوان بوو
بە سێوێکیشەوە بەردەوام گەنی کە کەوتە سەر
پیاوێک[1]

1 – ڕەنگە شووتییەک پێویست بووە بۆ درەخت   تا سێو نیوتۆن

نەنووسێ

3 – شەو   مانگ  سیری هەناسەیەکی درکاند  بۆ پێدەشتی کێو

سبەی کانیاوێک ڕوویدا   خوەرێکی زەرد هەڵگەڕاو دەس و چاوی لە

ئاودا شت   ئێوارە تەرمێکی سوور بە ئارەزووی پارکەوە لە پشتی

ئەو کێوەدا کەوت.

2 – ئێستا بە تەمای دوورێکەوە ماتەڵم   کێ ئەپەرمێتەوە بە جادە

من پێڵاو   یا پانتۆڵێک ماپاکۆفسکی تر   نەرمتر ئەبم

ئیتر بەسە خۆت بخە بە لایەکدا و بنووسە ،

بوون نا ئەنجامی دەرئەنجامێکە و

نەبوون دەرئەنجامی نائەنجامێک

بەولاکەیتردا بنووسە بێخەیاڵ

دونیا فنجانێکە قاوە – بیخۆی یا بیرێژی

:)  یا بیرێژی )

قسە و مسەم بەم شەوا

کە تەقدیری باران و جارانە

ئاوێتەی هەراو هوریای موتۆڕەو سەرشێتیەکانی خۆم[10] و ناخۆم و

دەنگی تۆ و – چەندین گەڕام لە شاران – و هاڕەهاڕی موتۆڕو  قژ و

قیژەی کوڕەکانی بێهودەو دەنگی موتۆڕ و درەخت و باو قاپێکی



خاڵیتر لە مانگ و ماپاکۆفسکی کە لە پانتۆڵەکەیدا هەورە و خۆ

نازانی چەندەبۆنی گوڵەیەخیشم لێ دێ و موتۆڕ و خەیاڵی خۆرێکی

گەرم و نیشتمانێکی نەرم

□

لێگەڕێن با دابەزین

ئێمە لە کایەکەدا نەبووین

10 – خۆم لە شوێنێکی منا جێماوە   تا ئەڕۆم هەر شاعیری

پیادەڕۆکانم  تا نارۆم دەستەکانم لە میوەفرۆشییەکدا ون ئەبن

خودی کایەکە بووین

کە دۆڕاین لە حکایەتێکا

ڕۆژێ لە ڕۆژان لەم ناوەدا

شتێ بوو گەلێکی پێ خەریک بوو

کەسێ بوو گەلێکی لێ بەر ئەبوو

یەکێ بوو گەلێکی پێ کەر ئەبوو

– کەسێ نەو بڵێ ئەم مەسخەرە بازییە

چیە –

ئەرێ خانمێ

تا ڕۆژێ لە بیاوان

یەکێ بوو یەکێ بوو

لە خۆیا فریارەسێ بوو

کەوتە رێ بەرەو دێ

هاتە شار، بازار، کار، ژیان، ژن، مەرگ، توون تەوەس!

شیر بوو شمشێر بوو خوا بوو خورما بوو

ئیتر تا ئیتر

شیر چوو، هوشتر چوو، ... ؟ خورما

ئێستە [1000]

1000 – چەند بچین و چۆن   مێژوو ئەماننووسێ تا نووسییێتمانی

شوناس، شۆڕش، هیتلر[1]، – فیلتر – دومکراسی، بومب، سەدام

خوێن، ریفراندۆم ،شوێن، نەوت ،یۆرانیۆم، نیشتمان، ئاو، بن

لادەن

زەوی سوور ئاسمان دوور[11]

www  ئێرە هەزارەی سێهەمە @ ئینسان – رەبی عەوزەڵ

نەکەی–

ئیمانم نەچێ بێئیمان بووین خانمێ!

بێ ئیمان



بەهاری 2005 سنە

1- مەسیح بە مناڵی هاتە زار و بازاڕ و خوێن شیرین بوو   هیتلر بە مناڵی نەهاتە زارو بازاڕو خوێن شیرین بوو   کێ ئەزانێ جیاوازییەکانی قاڵاو چۆنە؟

11- دونیا ئەگەر یۆرانیۆم بیبات   هاوسێکەمان هەر بەرماڵەکەی ئەشوات   دایکم هێشتا چۆلەکەکانی پێ گوناحە

تێبینی:

1- لە هیچ شوێنێکی ئەم شێعرەدا ژن رووت نەبووەوە تا زەوی روو بدات

2- عازە و عەنامی شێعرەکەم لەتر ئەبات لە سەرگەردانییەکانی پێم

3- لە شێعرێکدا بۆقەکانی ریلکە جیددیتر مردن   من لەم شێعرەدا شۆخی شۆخی ئەنفال ئەچم

4- ئەم شێعرە تابلۆیەکی بێدیوارە

وەنەوشەیی بۆ ئەو شەوانە من کەوتبووم بە لایەکدا

زەرد بۆ ئەو رۆژانە خۆت ئەخەی بەلایەکی تردا

سەوز بۆ هیچ

سپی بۆ تابلۆکە کە بڕیارە مردن بڵێ

ئەسڵەن چراکەت خامۆشکە  خۆت لە خۆتاو من لەم شێعرەدا فەرامۆش کە

PDF 4 KURD

## له چاپکراوەکانی پرۆژەی کتێبی یانەی قەڵەم

| ناوی کتێب | بابەت | نوسەرو وەرگێڕ |
|---|---|---|
| 1- فریوو خۆحەشاردان | چیرۆك | عەتا محەمەد |
| 2- ئایین (هزر سیاسەت) | سیاسی | یاسین عومەر |
| 3-بەیەکداکێشانی شارستانێتییەکان | سیاسی | ئاوات ئەحمەد |
| 4- سوەیلا | رۆمان | شارام قەوامی |
| 5-رۆژی هاتنەکەی عودەی | چیرۆك | ئاوات عەبدوڵلا |
| 6-سیماکانی عەقلانیەت و | سیاسی | ئاوات ئەحمەد |
| 7- وەنەوشەکەی چوارشەممان | چیرۆك | شیرین.ك |
| 8- نەبەهەشت لەسەر زەویدایە | سیاسی | ئومێد عوسمان |
| 9-فیمینیزم | فکری | عەبدوڵلا تاهیر بەرزنجی |
| 10-لە روانگەی خۆرئاواوە | فکری | ئومێد عوسمان |
| 11- مندالباز | رۆمان | فەرهاد پیربال |
| 12-کیمیاگەرانی وشە | ئەدەبی | یاسین عومەر |
| 13-گوزارشتی مۆسیقا | هونەری | حەمە کەریم عارف |
| 14-خەمەکانی رۆشنگەری | فکری | ئاوات ئەحمەد |
| 15-یەڵماز گۆنەی | هونەری | حەمە کەریم عارف |
| 16ـ هەناسەی پێخەفە داخراوە | چیرۆك | چنوور سەعیدی |
| 17 ـ سادقی هیدایەت | ئەدەبی | حەمە کەریم عارف |
| 18 ـ یادەوەرییەکانی کۆلانێکی | چیرۆك | سیامەند هادی |

نرخ(2000) دینار